زنجیرەی پەروەردەیی (١٧)

# هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە

# ( الشرك )

## گەورەترین گوناه و پوچەڵکەرەوەی چاکەکانە

ئامادەکردنی

حەمزە بەرزنجی

# هاوبەش دانان

# بۆ

# خوای گەورە ( الشرك باللّه )

ئامادەكردنی
حەمزە بەرزنجی

## پێشکەشە :

* بە موسڵمانان بە گشتی....هەموو ئەوانەی خۆئە پارێزن لە کردەوەیەك خوای گەورەیان لێ توورە بکات.

* بەوانەی لەم مانگە پیرۆزەدا بڕیاری تەوبەی یەکجاریان داوەو بە دوای حەقدا دەگەڕێن.

*بەو خوشك و برایانەی تامەزرۆن بە ڕوی گەشەوە دوور لە شیرك بەلیقای خوای خۆیان بگەن، تا شایستەی لێخۆشبوون بن.

* بە هەموو ئەوانەی ترسناکی ئەم گوناهەیان نەزانیووەو نازانن جۆرەکانی چین.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه.....

خوای پەروەردگار ئینسان و جنۆکەی دروستکردووەو فەرمانی پێ کردوون کە بە تەنیا پەرستشی ئەو بکەن و هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێن. سەرجەم پێغەمبەرانیشی بۆ گەیاندنی ئەم یەکخواپەرستییە ناردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ (الأنبياء: ٢٥)

واتە: وە ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە ئیلا نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نىیە بە هەق، کەواتە تەنها من بپەرستن.

لەبەر ئەوە ئەم یەکخواپەرستی یە دوور شیرك یەکەمین فەرزو واجبەو گەورەترین فیقه و زانستە، پێویستە بانگخوازان و پەروەردەکاران و مامۆستایان لە کاتی پەوەردەکردنی نەوەکاندا لەم خاڵەوە دەست پێ بکەن و بیکەنە دەستپێکی کاریان.

چونکە شیرك گەورەترین تاوانەو هەرکەسێك لەکارەکانیدا هاوبەش بۆ خوای گەورە دابنێت هیچ کردەوەیەکی قبوڵ نىیە، بگرە چاکەکانیشی هەڵوەشاونەتەوە -پەنا بە خوا- وە لە قیامەتیشدا هەر ئەوانە ڕزگار بوون کە لەگەڵ ئیمانەکەیاندا هیچ هاوبەشیان بۆ خوای گەورە بڕیار نەداوە. ئیسلامەتیش دانامەزرێت هەتا بەری نەبیت لە شیرك و کوفرو هەڵگرانی.

ئەمەش جێبەجێ کردنی مانای (لآ إلهَ إلاّ الله)یە، بە واتای هیچ پەرستراوێك شایستەی پەرستش بۆ کردن نىیە بە هەق جگە لە (الله). کە نەفی هەموو پەرستراوێکی تر دەکرێت بە گشتی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ. لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾ (الأنعام :١٦٢-١٦٣)

واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەی ئیماندار بڵێ: بەڕاستی نوێژو حەج و دروشمەکانی و (سەرجەم چاکە و بەندایەتیم) (شەعائیرم) هەروەها ژیان و مردنم (شەرائیعم) تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە. ئەو زاتە هیچ هاوەڵ و هاوبەش و شەریکێکی نیەو من بەوە فەرمانم پێدراوەو من یەکەم کەسی موسوڵمانانم.

وە ئەمە مافی خوای گەورەیە بەسەر بەندەکانی‌یەوە کە پێویستە ئەنجامی بدەن تا لە قیامەتدا ڕزگار ببن:

عن معاذ بن جبل (رضي الله عنه) أن النبي(ﷺ) قال له: «يامعاذ هل تدري ما حق الله على عباده»؟ قال: قلت: الله ورسوله أعلم. قال: «حق الله على عباده أن يعبدوه ولا يشركوا به شيئًا»، ثم سار ساعة ثم قال: «يا معاذ، هل تدري ما حق العباد على الله إذا فعلوه» قلت: الله ورسوله أعلم. قال: «حق العباد على الله أن لا يعذب من لا يشرك به شيئًا». متفق عليه: البخاري٧/٨٩ برقم(٥٩٦٧)، ومسلم١/٥٨ برقم(٣٠)، واللفظ للبخاري برقم(٢٨٥٦)، ورقم(٦٥٠٠).

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە موعاذی فەرموو: ئەی موعاذ ئایا ئەزانیت مافی خوای گەورە بەسەر بەندەکانی‌یەوە چی‌یە؟ دەفەرموێت: ووتم: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن. فەرمووی: مافی خوای گەورە بەسەر بەندەکانی‌یەوە ئەوەیە کە بە تەنها بیپەرستن و هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن. پاشان ماوەیەك ڕۆیشت و پاشان فەرمووی: ئەی موعاذ ئایا دەزانیت مافی بەندەکان بەسەر خوای گەورەوە(کە خۆی کردویەتییە ماف بەسەر خۆیەوە) چی‌یە ئەگەر ئەمەیان کرد؟ وتم: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن. فەرمووی: مافی بەندەکان بەسەر خوای گەورەوە ئەوەیە کە سزای ئەو کەسە نادات کە هیچ هاوبەشی بۆ دانەناوە.

کەواتە دوژمنی یەکتاپەرستی بریتی‌یە لە شیرك، شیرکیش زۆر جۆری هەیەو لە ناو ئەم ئوممەتەدا بڵاوەو چەندین بانگخوازیشی هەیە کە برەو بە شیرك و خانە شیرکییەکان دەدەن و پێڕی کاروانی دۆزەخییان گەرمترو زۆرتر دەکەن، زۆرێکیش لەو نێچیرانەی دەکەونە ناویەوە لەو موسڵمانانەن کە نوێژو ڕۆژوو چاکەی زۆریشیان هەیە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ﴾ (يوسف: ١٠٦)

واتە: وە زۆربەیان باوەڕ ناهێنن بە خوا مەگەر ئەوان لەوکاتەدا هاوبەش بڕیار دەرن بۆ خوا.

جا لەبەر ترسناکی و گەورەیی ئەم گوناهە هەستاین بە ناساندنی شیرك و جۆرەکانی تا بیانناسین و خۆمانی لێ بپارێزین و غەیری خۆشمانی لێ ئاگادار بکەینەوە. بۆ ئەوەی بەندایەتی‌یەکەمان ساغ و وەرگیراو بێت و ڕەنج بە خەساری دونیاو قیامەت نەبین، خوای گەورە دڵمان والآ بکات بۆ وەرگرتنی حەق.

## ترسناکی هاوبەش دانان بۆ خوا ( شیرك )

١- هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە گەورەترین گوناهە بە ڕەهایی، چونکە نوقسانی بڕیار دانە بۆ خوایەك کە خۆی لە بونی هاوبەش بە پاك گرتووەو پێویستی بە شەریك و هاوبەش نیيە، هەروەها چواندنی مەخلوقێکە بە خوای گەورە لە یەکێك لە تایبەتمەندیيەکانیدا، هەر بۆیە کاتێ پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد کە کام گوناهە گەورەترینە؟ فەرموی: « أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ...». البخاري ٤٤٧٧ ومسلم٨٦.

واتە: بریتیيە لەوەی هاوبەشێك بۆ خوا بڕیار بدەیت لە کاتێکدا هەر خوا تۆی بەدیهێناوە.

٢- وە شیرك ستەمە، بگرە گەورەترین زوڵم و ستەمە: چونکە ستەم بریتیيە لە دانانی شتێك لە غەیری جێگای خۆیدا، جا هەرکەسێك عیبادەتی بۆ غەیری خوا کرد ئەوا عیبادەتی لە غەیری جێگای خۆیدا داناوەو بۆ غەیری موستەحەققی خۆی ئەنجامداوە ئەمەش گەورەترین ستەمە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ ۖ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (لقمان: ١٣)

واتە: ئەی (موحەممەد(ﷺ) باسی ئەو کاتە بکە کە لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد و فەرمووی: ئەی کوڕە شیرینەکەم هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، چونکە بەڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە.

٣- خوای گەورە لە هەموو گوناهێك خۆش دەبێت تەنها لە شیرك نەبێت ئەگەر کەسەکە تەوبەی لێ نەکردبێت: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ۚ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا﴾ (النساء: ٤٨)

واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لەهەر گوناهێکی تر بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت، وە هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت ئەوە بێگومان گوناهێکی زۆر گەورەی هەڵبەستووە.

٤-شیرك سەراپای کردەوەکان هەڵدەوەشێنێتەوە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾(الزمر: ٦٥)

واتە: سوێند بەخوا با دڵنیابن کە وەحی نێردراوە بۆ تۆو بۆ ئەوانەی پێش تۆش: ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شەریك بۆ خوا بڕیار بدەیت کاروکردەوە چاکەکانیشت پووچەو دەچیتە ڕیزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە.

٥- ئەگەر کەسی موشریك تەوبە نەکات و بمرێت ئەوا بەهەشتی لەسەر حەرام کراوەو بە هەمیشەیی‌و نەمری لە دۆزەخدایەو هیچ شەفاعەتێك شمولی ناکات: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿.......إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾ (المائدة: ٧٢)

واتە: دڵنیابن ئەوەی شەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر حەرامکردووەو شوێن و جێگاو سەرەنجامی ئاگرە، ئەوسا ئەو ستەمکارانە هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نییە (کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت).

٦- موشریك خوێن و سامانی حەڵاڵە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا انْسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (التوبة :٥)

واتە: جا کاتێك مانگە حەرامەکان بەسەرچوون (کە بریتین لە: ذوالقعدة، ذوالحجة، محرم، رَجب) ئەوە هاوەڵگەران بکوژن لەهەر کوێ دەستتان لێیان گیر بوو، یاخود بەدیل بیانگرن، سنوور دانێن بۆ چالاکیان، هەروەها کەمین و بۆسەیان لە هەموو شوێنێکی لەباردا بۆ دانێن، جا ئەگەر (پێش ئەوەی دەستی ئێوەیان بگاتێ) تەوبەیان کردو وازیان هێنا لەو کارەیان و نوێژیان کردو زەکاتیاندا، ئەوە وازیان لێبهێنن و ڕێیان بۆ چۆڵ بکەن، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو بەبەزەییە.

وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « أمرت أن أُقاتِل النّاس حتى يقولوا: لا إله إلا الله، فإذا قالوا: لا إله إلا الله، عصموا مني دماءهم وأموالهم، إلاّ بحقها وحسابهم على الله، ثم قرأ: ﴿ إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ. لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُصَيْطِرٍ﴾». أخرجه مسلم والترمذي والحاكم وأحمد وصححه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة برقم(٤٠٩).

واتە: فەرمانم پێ کراوە کە لەگەڵ خەڵکیدا بجەنگم هەتا دەڵێن: (لا اله الا الله). ئەگەر وتیان ئەوا خوێن و سەروەتیان لەسەر من حەرامە مەگەر بە هەقی ئیسلام، وە

حیسابیشیان لەسەر خوایە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ. لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُصَيْطِرٍ﴾ (الغاشية : ٢١-٢٢)

واتە: کەواتە (تۆ ئەی پێغەمبەر(ﷺ)) ئەم شتانە بخەرەوە یادیان و ئامۆژگاریان بکە، بەڕاستی تۆ هەر یادخەرەوەیت. هیچ دەسەڵاتێکت نیە بەسەر دڵ و دەروونیاندا (تا بە زۆر باوەڕداریان بکەیت).

# پێناسەی ( الشِرك )

هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە(الشرك) لە زمانەوانیدا واتە هاوبەش کردن، وە بەم مانایانەش دێت:

تێکەڵ کردن و هاوڕێیەتی کردن و هاوبەشی پێ کردن، دەڵێن: هاوبەشم کردو کردمە شەریکی خۆم..../ لسان العرب٧/٩٩ وتاج العروس٧/١٤٨ وتهذيب اللغة١٠/١٧.

<u>لە شەرعدا</u>/ واتە دانانی هاوبەشێك بۆ خوای گەورە لە یەکێك لەو تایبەتمەندیانەدا کە خۆی پێ تایبەت کردووە، جا ئیتر ئەو هاوبەش دانانە لە (ربوبییەتدا) بێت یان (ألوهیەت) یان (أسماء و صِفات)، بەڵام زۆربەی جار لە (ألُوهییەت)دا شیرك بڕیار دەدرێت:

١- **لە ربوبییەتدا**: تەنها خوای گەورە دروستکەرو خاوەن موڵك و هەڵسوڕێنەری بوونەوەرو سوودو زیانگەیەن و ژییەنەرو مرێنەرە. جا هەرکەسێك لە یەکێك لەم تایبەتمەندیانەدا هاوبەشێك بۆ خوا بڕیار بدات ئەوە شیرکی بڕیار داوە لە ربوبییەتدا.

٢- **لە ئولوهییەتدا**: تەنها خوای گەورە شایستەی پەرستش(عیبادەت) بۆ کردنە لە هەموو جۆرەکانی پەرستشدا. خۆ ئەگەر کەسێك جۆرێك لە جۆرەکانی عیبادەت ئەنجامبدات بۆ غەیری خوا ئەوا شیرکی بڕیار داوە لە ئولوهییەتدا.

٣- لە أسماء و صفاتدا: خوای گەورە چەندین ناوی جوان و سیفەتی بەرزی هەیە کە کەس هاووێنەی نییەو لە کەس ناچێت. هەرکەسێك هاوتا بۆ خوا بڕیار بدات بە هەمان شێوە شیرکی ئەنجامداوە.

# جۆرەكانی هاوبەش دانان بۆ خوا( الشرك )

هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە(الشرك) چەندین جۆرو نمونەی هەیە وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: «الربا سبعون باباً و الشرك مثل ذلك». رواه البزار عن ابن مسعود وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم(٣٥٤٠).

واتە: ڕیبا(سوو) حەفتا بەشەو هاوبەش دانانیش بۆ خوا بە هەمان شێوە.

بەلاّم زۆر كەس وا دەزانن تەنها سەجدە بردن بۆ بتێك هاوبەش بڕیاردانەو بەس!!!

جا بە گشتی وەك زانایان دابەشیان كردووەو فەرمویانە: شیرك دوو جۆرە: شیركی گەورەو شیركی بچوك:

## جۆری یەكەم: شیركی گەورە:

ئەمیش بە مانای كوفری گەورەیە، گەورەترین گوناه و تاوانە. سەراپای كردەوە چاكەكان هەڵدەوەشێنێتەوەو خاوەنەكەی لە بازنەی ئیسلام دەباتە دەرەوەو ئەگەر مردو تەوبەی لێ نەكردبوو بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوەو لە قیامەتیشدا شەفاعەتی شەفاعەتكارانی بۆ نییە. بەگشتی بریتییە لەوەی كەسێك جۆرێك لە جۆرەكانی پەرستش ئەنجام بدات بۆ غەیری خوا.

شێخ عبد الرحمن بن ناصر السعدی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: ( سنوورو پێناسەی شیركی گەورە كە هەموو جۆرو شێوازەكان لە خۆ بگرێت بریتییە لەوەی: (بەندە جۆرێك یان دانەیەك لە جۆرەكانی پەرستش ئەنجام بدات بۆ غەیری خوا). جا هەموو بیروباوەڕێك، یان ووتەیەك، یان كردەوەیەك كە خوی گەورە فەرمانی بە كردنی دابێت ئەوا ئەنجامدانی بۆ خوای گەورە بریتییە لە یەكخواپەرستیو ئیمان و ئیخلاص، وە ئەنجامدانی بۆ غەیری خوا بریتییە لە شیرك و كوفر، جا ئاگاداری ئەم ڕێكخستنە بە بۆ شیركی گەورە، چونكە هیچ شتێكیش ڕیزپەری ئەمە نییە). القول السدید في مقاصد التوحید ص٥٨.

كەواتە شیرك پێچەوانەی یەكخواپەرستییە هەروەك چۆن كوفر پێچەوانەی ئیمانە:

## شیركی گەورەش چەندان جۆری هەیەكە هەمویان یەك حوكمیان هەیە :

١- هاوبەش دانان بۆ خوا لە پاڕانەوەو داواكردندا: چونكە پاڕانەوە عیبادەتەو دەبێت هەر بۆ خوا ئەنجامبدرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَدْعُ مِنْ دُونِ اللهِ مَا لَا يَنْفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِنْ فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِنَ الظَّالِمِينَ ﴾ (یونس :١٠٦)

واتە: هاناو هاوار نەبەیت بۆ كەسێك یان شتێك لە جیاتی خوا، كە نە قازانجت پیٚ دەگەیەنێت نە زیان (چونكە قازانج و زیان هەر بەدەست خوایە)، خۆ ئەگەر كاری وا ئەنجام بدەیت، ئەوە بەڕاستی تۆ لە ستەمكارانیت.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « مَنْ مَاتَ وَهْوَ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ نِدًّا دَخَلَ النَّارَ». البخاري٤٤٩٧.

واتە: هەركەسێك بمرێت و لە غەیری خوا هاوبەشێكی تری بۆ دانابێت لێی پاڕابێتەوە دەچێتە دۆزەخەوە.

وەك داواكردنی شیفاو ڕزق لە مردووان و پیاوچاكان و چوونە سەر گۆڕەكانیان و پاڕانەوەو بانگ كردنیان، یان وتنی: یا رسول اللە..یاحسین، یا شێخ عیساو موسا، یا شێخی كربچنە..یا شێخی گەیلانی....یا غەوث هاوار....وە هاووێنەی ئەم وتانەی لە ناو خەڵكیدا زۆر دەوترێت -پەنا بە خوای گەورە-.

٢- هاوبەش بڕیاردان لە نێت و نیازو مەبەستدا: وەك ئەوانەی كارو كردەوەیەكی چاك دەكەن بەتەواوی هەموو ویست و مەبەستیان لەبەر خاتری خەڵكیە. وەك مەبەستی مونافیقەكان. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ، أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾(هود: ١٥، ١٦).

واتە: هەر كەسێك تەنها ژیانی دنیاو ڕازاوەیی و (خۆشگوزەرانی) یەكەی بوێت. ئەوە پاداشتی هەوڵ و كۆششی ئەو جۆرە كەسانە دەدەینەوە لە دنیادا، ئەوانیش تێیدا هیچیان لێكەم ناكرێتەوە. ئا ئەوانە لە ڕۆژی دوایدا جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچی تریان بۆ

نیەو ئەوەی کە کردیان لە دنیادا پووچەڵ بۆوەو بێ نرخە، هەروەها ئەو کاروکردەوەی کە دەیانکرد بەتاڵ و پووچ و بۆشە.

٣-هاوبەش بڕیاردان لە گوێڕایەڵی کردندا: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (التوبة: ٣١).

واتە: (گاورو جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خوا (ملکەچ و فەرمانبەرداریانن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن) هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش (بەکوڕی خوا دەزانن) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە خوایەك، بێگومان جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە، پاکیو بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەیە، کە (ئەو نەفامانە) هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن.

ئەمیش بریتییە لە گوێڕایەڵی کردنی غەیری خوا لە تەشریع و حوکمدا، لە حەڵاڵ کردنی حەرامێك یان حەرام کردنی حەڵاڵێك، یان بڕوا بوون بەوەی کەسێك مافی دیاری کردنی حەڵاڵ و حەرامی هەیە جگە لە خوای گەورە، یان حوکم بردنەوە بۆ لای یاساو دەستووره نەفامێتییەکان. وەك ئەوەی ئەمڕۆ دەبینرێت سەرکردەکان میللەتەکانیان بە یاساو پرۆگرامی دەستکرد دەبەن بەڕێوەو حوکمی خوایان کەنار خستووەو بگرە بە دواکەوتوویی ناوی دەبن و پێیان وایە شیاو نییە بۆ ئەم زەمانە!! وە چەندان شتی حەرامییان بە یاسا بۆ حەڵاڵ کردوون هەر لە داوێن پیسی و ڕیباو خراپەوە. زۆرێکیش لە حەڵاڵ کراو بگرە واجبەکانیشیان قەدەغە کردووە.

کاتێ عەدی کوڕی حاتەم گوێی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ﴾ دەفەرموێت: وتم: خۆ ئەوان ئەو پێشەوایانەیان نەدەپەرست! فەرموی: « أجَل ولكن يحلون لهم ما حرم الله فيستحلونه، ويحرمون عليهم ما أحل الله فيحرمونه، فتلك عبادتهم لهم ». واتە: بەڵێ بەڵام ئەوان شتانێکیان بۆ حەڵاڵ دەکردن کەخوای گەورە حەرامی کردووە لە سەریان ئەوانیش بە حەڵاڵیان دەزانی، وە شتانێکیشیان لێ حەرام دەکردن کە خوای گەورە حەڵاڵی کردووە ئەوانیش بە حەرامیان دەزانی، جا ئەمە پەرستنیانە بۆیان./ رواه البيهقي١٠/١١٦ وهو عند الترمذي برقم ٣٠٩٥ وحسنه الألباني في غاية المرام ص:١٩.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: «....وما لم تحكم أئمتهم بكتاب الله، ويتخيروا مما أنزل الله إلا جعل الله بأسهم بينهم». رواه ابن ماجه (٤٠١٩) وأبو نعيم والحاكم٤/٥٤٠ وصححه الالباني في السلسلة الصحيحة١/١٦٧ برقم(١٠٦).

واتە: وە هەرکاتێك پێشەواکانیان بە قورئانەکەی خوا حوکمیان لە نێواندا نەکردن و چاوەڕوانی خێرو چاکەو کامەرانی نەبوون لەوەدا کە خواناردویەتی، ئیلا خوای گەورە کێشەو کوشتار دەخاتە نێوانیانەوە.

جا هەرکەسێك حاڵی وابوو ئەوە لەو طاغوتانەیە کە خوای گەورە فەرمانی کردووە بێ باوەڕ بین پێی. چونکە طاغوتەکان زۆرن و سەرەکانیان پێنجن: ئیبلیس، وە هەرکەسێك بپەرسترێت و پێی ڕازی بێت، وە کەسێك بانگەوازی خەڵکی بکات بۆپەرستنی خۆی، وە هەرکەسێك بانگەشەی زانینی علمی غەیب بکات. وە هەرکەسێکە کە حوکم بکات بە غەیری ئەو قورئانەی خوا ناردویەتی/ شرح ثلاثة الأصول للشيخ محمد صالح العثيمين ص١٥٣-١٥٤.

٤- هاوبەش بڕیار دان لە خۆشویستندا: خۆشویستنی غەیری خوا (جا هەرکەسێك بێت) وەك خۆشەویستی خوا شیرکە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ..﴾ (البقرة: ١٦٥).

واتە: وە کەسانی وا هەیە لە خەڵکی کە هاوبەشی زۆر بۆ خوا بڕیار دەدەن بەوەی خۆشیان دەوێن وەك خۆشەویستی(ئیمانداران بۆ) خوا.

٥- ترسان لە غەیری خوا (لە مردوان و جنۆکە) بەوەی توشی زیانێکی بکەن: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِنْ دُونِهِ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾.(الزمر: ٣٦)

واتە: مەگەر خوا بەس نیە کە پشتیوان بێت بۆ بەندەی خۆی کە پێغەمبەرە(ﷺ)، کەچی ئەوان تۆ دەترسێنن بە شتی تر جگە لە خوا، خۆ ئەوەی خوا گومڕای بکات و سەری لێبشێوێنێت، ئیتر کەس ناتوانێت دەستی بگرێت و ڕێنمویی بکات.

بەڵام ترسی سروشتی وەك: ترسان لە ئاژەڵی دڕندەو ستەمکارێکی زیندو شیرك نیەیەو دروستە.

٦- داوای کۆمەکیو پشتیوانی(الإستعانة) لە شتێکدا کە تەنها خوای گەورە توانای بەسەریدا هەبێت، وەك داواکردنی سەرخستن و ڕزگار کردن و شیفادان و منداڵ بەخشین و ڕزق دان و....هتد. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (الفاتحة: ٥)

واتە: خوایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لەتۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین.

وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ابن عباسی فەرموو: (..إذا سألت فاسأل الله، وإذا استعنت فاستعن بالله..).رواه أحمد والترمذي وصححه الألباني أنظر صحيح الجامع برقم(٧٩٥٧).

واتە: ئەگەر داوات کرد تەنها لە خوا داوابکەو ئەگەر داوای هاوکاری و پشتیوانیت کرد هەر لە خوای بکە.

بەڵام داوای کۆمەکی کردن لە غەیری خوا بەم سێ مەرجە دروستە: یەکەم: لە کەسێکی زیندوو. دووەم: ئامادەی ئەو جێگایە بێت. سێیەم: لە شتێکدا بێت کە توانای هەبێت بۆت بەجێ بگەیەنێت. وەك یارمەتی لێ وەرگرتنی لە کارو پرۆژەیەکی چاکەو خێردا.

٧- داوای فریاکەوتن(الأستغاثة) بۆ لابردنی نارەحەتیو تەنگانەیەك: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ .... ﴾. (الأنفال: ٩)

واتە: یادی ئەوکاتە بکەنەوە کە لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوەو داوای یارمەتیتان لێ دەکرد، خوایش خێرا هات بە هاناتانەوە...

ئەم شیرکەش لە وێنەی ئەوەی دەڵێن: یا فلان هاوار!!! بەجۆرێ لەکاتی هەڵنوتینیشدا هاواریان لێ دەکەن!!!

٨-پەنا گرتن بە غەیری خوا: وەك ئەوەی زوو موشریکەکان پەنایان دەگرت بە جنۆکەکان. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْإِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾.(الجن: ٦).

واتە: بەڕاستی پیاوانێك لە دەستەی ئادەمیزاد پەنایان دەبرد بە پیاوانێك لە دەستەی جنۆکەکان (ئەوانیش ئەمەیان بەهەلزانی) کەچی ئەوەندەی تر مانوویان کردن (بەخورافات و شتی بێ سەرو بەر).

٩- بڕوا بوون بە توانای پێغەمبەران و پیاوچاکان لە بەڕێوەبردنی بونەوەردا لەگەڵ خوادا!!، یان بڕوا بوون بە تواناو کاریگەری ئەستێرەو هەسارەکان لە ڕووداوەکان و

ژیانی خەڵکی دا. کە ئەمانە تەنها بە دەست خوایە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ..وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ..﴾. (یونس :٣١)

واتە:...وە کێیە کە هەموو کارو فرمانەکان جێبەجێ دەکات و گۆڕانکاریان بەسەردا دەهێنێت، دەڵێن: الله..

وەك پشت بەستن بە بورج و ئەستێرەکانی بەخت لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا، جا ئەگەر کەسێك بڕوای بە کاریگەرییان هەبێت پێی موشریك دەبێت، وە ئەگەر تەنها بۆ خۆشی بیانخوێنێتەوە تاوانبارە چونکە نابێت موسڵمان خۆشی ببینێت لە خوێندنەوەی شیرك، وێڕای ئەمە لەوانەیە شەیتان بەهۆیەوە توشی بڕوا پێ بونی بکات کە ئەو کاتەش بۆتە هۆکارێك بۆ شیرکەکە.

١٠- سەربڕین بۆ غەیری خوا: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ﴾ (الکوثر: ٢)

واتە: دەی کەواتە نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت وە قوربانی سەر ببڕە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « لعن الله من ذبح لغير الله». رواه مسلم (١٩٧٨).

واتە: نەفرەتی خوا لەو کەسەی شتێك سەردەبڕێت بۆ غەیری خوا.

جا سەربڕین بۆ غەیری خواو سەربڕینێکیش لەسەر غەیری ناوی خوا هەردوکیان حەرامەو گۆشتی سەربڕاوەکەش خواردنی حەرام دەبێت، وەك سەربڕینی سەردەمی نەفامی بۆ جنۆکە، کاتێ خانویەکیان بکڕیایە یان بیرێکیان هەڵبکەندایە ئاژەڵێکیان لەلایدا سەردەبڕی لە ترسی زیانی جنۆکە./ تيسير العزيز الحميد ص(١٥٨).

یان سەربڕین لەبەردەم سەرکردەیەکی طاغوت یان کەسێکدا، یان ناوهێنانی غەیری خوا لەکاتی سەربڕینیدا وەك دەوترێت: لە ڕاهی خواو....شتی تری بۆ زیاد دەکەن.

١١- نەزر ئەنجامدان بۆ غەیریخوا لە ئینسان و جنۆکە: نەزریش واجب کردن یان لەسەر خۆ قەدەغە کردنی شتێکە کە لە شەرعدا پێویست نەکراوە. وەك ئەوەی بڵێت: ئەی فلأنە شێخ ئەگەر ئەوەم بۆ بکەیت لەسەرم نەزر بێت ئەوەت بۆ بکەم، بەجۆرێك هەندێ گۆڕ ناوبراوە بە(نەزرگا) واتە جێگای نەزر! لە کاتێکدا نەزر تەنها بۆ خوای گەورە دەکرێت و بەس، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَتُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾. (آل عمران: ٣٥).

واتە: (بەیاد بێنە) کاتێك هاوسەری عیمران وتی: پەروەردگارا بەڕاستی من بڕیارم داوەو نەزرم کردووە ئەو منداڵەی لە سکمدایە ئازاد کراوبێت لە هەموو ئەرك و ئیش و کارێك (تا هەر لە خزماتی بیت المقدس دا بێت) دە تۆش لێم وەربگرە، چونکە بەڕاستی تۆ خوایەکی بیسەرو زانایت.

١٢–تەواف: خوای گەورە دەفەرموێت:﴿...وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ (الحج:٢٩).

واتە: وە بەدەوری ماڵی دێرین و بەنرخی خوا (کەعبە)دا با (طەواف) بکەن.

وەك ئەمەی ئەمڕۆ دەبینرێت لە سوڕانەوە بە دەوری گۆڕی پیاوچاکان و بەگەورەگرتنی. وە دەستی پیا دەهێنن و سەجدەی بۆ دەبەن و لە خۆڵەکەی دەموچاو هەڵدەکێشن و بە ترس و لەرزەوە لەبەردەمیدا دەوەستن و داوای لێ دەکەن.

١٣– تەبەروك کردن بە گڵ و دارو بەردو پەڕۆ: وە بە هەر شتێك کە لە شەرعدا نییە:

جا کاتێ هاوەڵەکان دایان بە لای داری (ذات أنواط)دا کە دارێك بوو موشریکەکان لایدا دەمانەوەو چەکەکانیان پێیدا هەڵدەواسی بە مەبەستی کاریگەر بوونی، بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)یان فەرموو: دارێکی (ذات انواط)ش بۆ ئێمە دابنێ وەك ئەوەی ئەوان هەیانە.

فەرمووی: « سُبحان الله، هذا کما قال قوم موسى اجعل لنا إلهاً کما لهم آلهة، والذي نفسي بیده لترکبن سنة من کان قبلکم».أخرجه الترمذي(٢١٨٠) وصححه الألباني أنظر ظلال الجنة (٧٦)، المشکاة (٥٣٦٩).

واتە: پاکو بێ عەیبی بۆ خوا، ئەمە وەك ئەو وتەیەی گەلەکەی موسا وایە کە وتیان: پەرستراوێکمان بۆ دابنێ وەك چۆن کافرەکان هەیانە. سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بە دەستە شوێن ڕێچکەی تاوانی ئەوان دەکەون.

١٤–ئومێد پێ هەبوون(الرجاء) و پشت بەستن(التوکل) بە غەیری خوا لە شتێکدا کە تەنها خوای گەورە توانای هەیە وەك پشت بەستن بە غەیری خوا بۆ سەرخستن و شیفادانی نەخۆشی و.. هتد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ (المائدة:٢٣).

واتە: بە تەواویی پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

١٥- جادو(السِحر): خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَٰكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنْزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ...﴾. (البقرة: ١٠٢)

واتە: (ئاشکرایە کە) هەرگیز سولەیمان کافر نەبووە، بەڵکو شەیتانەکان کافربوون و خەڵکیان فێری سیحرو جادوو دەکرد، هەروەها مەردومیان فێری ئەوە دەکرد کە بۆ هاروت و ماروت دابەزی بوو (کە دوو فریشتە بوون) لە بابل (مەبەستیشیان تێگەیاندنی خەڵکی بوو لە سیحرو جادوو). ئەوانیش کەسیان فێری هیچ شتێك نەدەکرد تا پێیان نەوتایە: ئەم کارەی ئێمە بۆ تاقی کردنەوەیەو خۆت کافر مەکە.

١٦- فاڵچێتیو بانگەشەکردنی زانینی غەیب و خوێندنەوەی لەپی دەست و قاوەگرتنەوە: حوکمی ئەو کەسەی دەچێتە لای فاڵچیەك ئەگەر بڕوای پێ بکات کافر دەبێت -پەنا بە خوا-، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « من أتى عرافا أو كاهنا فصدقه بما يقول فقد كفر بما أنزل على محمد ». رواه أحمد ٤٢٩/٢ وصححه الألباني في صحيح الجامع ٥٩٣٩.

واتە: هەرکەسێك بچێتە لای کەسێك کە بانگەشەی زانینی جێگای شتێکی وون دەکات، یان فاڵچیەك کە بانگەشەی زانینی غەیب بکات و بڕوا بە قسەکانی بکات ئەوە کافر بووە بەو قورئانەی نێردراوەتە سەر محمد(ﷺ).

خۆ ئەگەر هەر بۆ تەجرەبە بچێت و بڕوای پێ نەکات ئەوا نوێژی چل ڕۆژی قبوڵ نیيە. هەرچەند واجبە لەسەریشی نوێژ بکات و تەوبەش لە کارەکەی بکات. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَىْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ». صحيح مسلم ١٧٥١/٤برقم(٢٢٣٠).

واتە: هەرکەسێك بچێتە لای فاڵچیەك و پرسیاری شتێکی لێ بکات چل شەو نوێژی قبوڵ نیيە.

١٧- شەفاعەت: هەندێك کەس مردووەکان دەکەنە تکاکارو دەڵێن خۆ ئێمە لەم مردوانە ناپاڕێینەوەو نایانپەرستین، بەڵکو تەنها دەیانکەینە واسیتەیەك لە نێوان خۆمان لەگەڵ خوادا! چونکە بڕوامان وایە ئەمانە پیاوچاك بوون و لە خوا نزیکن و ئەمانە تکامان بۆ دەکەن لای خوا،!! کە بەم کارەیان شیرکیان بۆ خوا داناوە، چونکە خوای گەورە لە

بەندەکانی نزیکەو پێویستی بە واسیطة نیە. وە موشریکەکانی زووش هەمان بەهانەیان دەهێنایەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ .....﴾ (الزمر:٣)

واتە: ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ ۚ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (يونس:١٨)

واتە: بێ باوەڕان شتێك دەپەرستن لەجیاتی خوا کە نە زیانیان پێدەگەیەنێت نە قازانج، دەشڵێن: ئا ئەو بت و شتانە تکاکارمانن لای خوا، پێیان بڵێ ئەی محمد(ﷺ): باشە ئایا ئێوە خوا ئاگادار دەکەنەوە بەشتێك کە لەئاسمانەکان و لەزەویدا هەبێت و خوا نەیزانێت؟! پاك و بێگەردەو بەرزو بڵندەو دوورە لەوەی کەنەفامان دەیکەن بەهاوەڵی.

## جۆری دووەم : شیرکی بچوك :

بریتی‌یە لە هەر گوناهێك کە لە دەقە شەرعییەکانی قورئان و سوننەتدا بە شیرك ناوی هاتبێت و نەگەیشتبێتە ئاستی شیرك، لەگەڵ هێشتنەوەی ناوی ئیمان بە خاوەنەکەیەوە، بەڵکو هۆکارێك بێت بۆ کەوتنە ناو شیرکە گەورەکەوە، کە ئەم جۆرەی شیرکیش گەورەترینی گوناهە گەورەکانە. بەڵام ئەم جۆرە خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام ناباتە دەرەوەو بنچینەی ئیمانەکەی ناسڕێتەوە، حوکمەکەشی ئەوەیە پێویستە تەوبەی لێ بکات، خۆ ئەگەر مردو تەوبەی نەکردبوو ئەوە لە ژێر ویستی خوای گەورەدایە، ئەگەر ویستی بێت سزای دەدات و ئەگەر ویستی بوو لێی خۆش دەبێت،

خۆ ئەگەر سزایدا ئەوە بە نەمریو هەتایی لە دۆزەخدا نایهێڵێتەوەو شەفاعەتی شەفاعەتکارانی بەردەکەوێت بە ئیزنی خوای گەورە.

شێخ عبد الرحمن بن ناصر السعدی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (سنوری شیرکی بچوکیش بریتییە لە هەر هۆکارو ڕێگایەك کە سەردەکێشێت بۆ شیرکی گەورە، لە نێت، یان ووتەکان، یان ئەو کردارانەی نەگەیشتونەتە پلەی عیبادەت./ القول السديد في مقاصد التوحيد، لعبد الرحمن بن ناصر السعدي، ص٥٨.

## شیرکی بچوکیش دوو جۆرە:

**جۆری یەکەم:** شیرکی ئاشکرا(ظاهِر)، کە ئەمیش دوو جۆرە: شیرکی ووتەو کردەوە:

**بە ووتەش وەك:**

١-وەك سوێند خواردنی زارەکی بە غەیری خوا: چونکە سوێند خواردن جۆرێکە لە بەگەورەزانینی سوێند پێ خوراو:

لە ابن عمرەوە گوێی لێ بوو پیاوێك وتی: نەخێر سوێند بە کەعبە! ابن عمر فەرموی: نابێت بە غەیری خوا سوێند بخورێت، من بیستومە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرمویەتی: «من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك». رواه الترمذي وحسنه وابن حبان في صحيحه و صححه الألباني أنظر صحيح الترغيب والترهيب٣/٧٦ برقم(٢٩٥٢).

واتە: هەرکەسێك سوێندی خوارد بە غەیری خوا ئەوە کوفری کردووە یان شیرکی کردووە.

وەك ئەوەی ئەمڕۆ دەبینرێت سوێند دەخورێت بە: پێغەمبە(ﷺ)، تەڵاق، سەری باوك، گۆڕی دایك، چاوی برا، ناموس، نمەك، گۆڕی شەهیدان، بە فلانە شێخ و فیسارە پیاوچاك و فلانە سەرکردە....هتد.

کەفارەتی ئەمەش ئەوەیە بڵێت: (لا اله الا الله)چونکە

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: وَالـلاّتِ وَالْعُزَّى، فَلْيَقُلْ: لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ.....». البخاري برقم(٤٨٦٠).

واتە: هەرکەسێك سوێندی خوارد بە (لات) و (عوزا)( کە دوو بتی سەردەمی نەفامین) با بڵێت: (لا إله إلا الله).

عبداللەی کوری مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمویەتی: ئەگەر بە درۆوە سوێند بخۆم بە خوا، پێم خۆشترە لەوەی سوێند بخۆم بە غەیری خوا بە ڕاست./ رواه الطبراني موقوفا ورواته رواة الصحيح وصححه الألباني أنظر صحيح الترغيب والترهيب٣/٧٦ برقم(٢٩٥٣).

٢-ووتنی: ئەگەر خوا(و) تۆ ویستی لێ بێت، یان دانانی پیتی (و) لەنێوان ناوی خوای گەورەو کەسێکی تردا:

لە ابن عباسەوە دەفەرموێت: پیاوێك بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)ی ووت: (ما شاء الله وشئت!) ئەگەر خواو تۆ ویستتان لێ بێت! ئەویش فەرموی: «جعلتَ لله ندّاً ؟! ما شاء الله وحده» ئایا هاوتات بۆخوا دانا؟! بڵێ: تەنها ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت./ صححه الألباني أنظر صحيح الأدب المفرد١/٢٩٠ برقم(٧٨٣/٦٠٥).

چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ (التكوير :٢٩)

واتە: ویستی ئێوەش نایەتە دی مەگەر کاتێك خوای پەروەردگاری جیهانیان بیەوێت.

یان وتنی: ئەگەر خواو دکتۆر نەبوایە دەمرد، ئەگەر خواو فلأن نەبوایە لەبرسا دەمرد، خواو تۆ شك دەبەم، لە سایەی خواو سەری تۆوە........هتد.

٣- ناونانی کەسێك بە (مَلِك المُلوك) شاهنشا، یان (قاضي القُضاة). وە دانانی ووشەی (عَبد) بۆ غەیری ناوی خوا، وەك: (عبدالحسين، عبدالعلي. عبدالرسول...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « أخنع اسم عند الله يوم القيامة رجل تسمى ملك الأملاك». صححه الألباني في السلسلة الصحيحةبرقم(٩١٥).

واتە: بێزراوترین ناو بە لای خوای گەورەوە لە ڕۆژی دواییدا پیاوێکە ناونرابێت (ملك الأملاك) شاهنشاه.

## وە بە کردەوەو ئەندامەکانیش وەك:

١-لە دەست  یان مل کردنی بەڕۆو موفەڕك و دەزوو بە مەبەستی دوور خستنەوەو لابردنی بەڵاو نەخۆشی بەوەی بڕوای وابێت ئەمانە وەسیلەیەکن و خوای گەورە بە هۆیەوە شیفا دەنێرێت، خۆ ئەگەر پێی وابێت ئەمانە بۆ خۆیان شیفادەرن ئەوە شیرکی گەورەیە پەنا بە خوا.

٢- هەڵواسینی نوشتەو مورووە شینەو چاوەزار بە ماڵ و سەیارەو منداڵ و دوکان و...هتد، لە ترسی چاوپیسی.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ ». رواه أحمد وابن ماجة وأبو داود، وصححه الألباني أنظر صحيح الجامع(١٦٣٢).

واتە: بە تەئكید نوشتەو (التمائم) (كۆی التمیمەیە بریتیيە لەو مورو ناڵ و شتانەی هەڵدەواسرێن بۆ لابردنی بەڵاو چاوپیسی) و(التِوَلة): شتێكە دروستی دەكەن بە مەبەستی شیرین كردنی ژن لای مێردەكەی وە بە پێچەوانەشەوە. هەموو ئەمانە شیركن.

زۆربەی جار بۆ سەر لێ تێكدانی خەڵكی عەوام بەناو شێخێك نوشتەیەك دروست دەكات چەند ئایەتێكی تێدا دەنوسێت و شتی تری تێكەڵ دەكات لە خشتەو ناوی جنۆكەو بە دەست و خەتی ئاڵۆز دەینوسێت، بگرە زۆر جار بە پیسیو خوێنی حەیز دەینوسن و پارەیەكی زۆری پێ دەپچڕن لە هەژارو نەفامان.

٣- بە شووم زانینی هەندێك شت لە كاتی بینینیاندا یان بیستنیانداو گەڕانەوە لە كارێك كە نییەتت هەبووە ئەنجامی بدەیت لەبەر ئەمە. وەك ڕەشبینی و بەشووم زانینی مانگی صەفەر و فلانە ڕۆژو ژمارە وەك ژمارە(١٣) و دەنگی فلانە باڵندە وەك كوندەپەپوو، قەلە ڕەش و كەڵەشێر لە ئێوارانداو، وە پژمین لەكاتی سەفەردا......چونكە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « الطيرة شرك ». رواه الإمام أحمد ٣٨٩/١ وصححه الألباني أنظر صحيح الجامع (٣٩٦٠).

واتە: بە شووم زانینی شت شیركە.

جا ئەگەر بە تەمای كارێك بوو یەكێك لەو شتانەی بینیو ئەوە بووە هۆی ئەوەی لە كارەكەی گەڕاندیەوە ئەوە شیركی ئەنجامداوە. خۆ ئەگەر نەگەڕایەوە بەڵام لە دڵیدا ئەو بەشوم زانینە شوێنەوارێكی دروست كردو وەسوەسەو خەمباری كرد پێویستە لەسەری پشت بە خوا ببەستێت و لە دڵیدا لایببات و بڵێت: « اللهم لا طيرَ إلا طيرُك ، ولا خيرَ إلا خيرُك ، ولا إله غيرُك». رواه أحمد وابن السني والطبراني وصححه الألباني أنظر السلسلة الصحيحة برقم(١٠٦٥).

واتە: خوایە هیچ شتێك (لە باڵندەو شتی تر) سوودو زیان ناگەیەنێ جگە لە تۆ. وە هیچ خێرێك جێگەی ئومێد نییە جگە لە خێری تۆ. وە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ.

## جۆری دووەم: شیرکی شاراوەیە(الخَفي):

کە ئەویش بریتیە لە شیرکی نییەت و مەبەست، واتە ڕییاو ڕوپامایی و سومعە، بەوەی کارێکی چاك ئەنجامبدات بۆ خوا بەڵام حەز بکات خەڵکی ببینن یان باسی بکەن: وەك ئەوەی نوێژەکەی درێژ بکاتەوەو جوان بیکات یان خێرێك بکات تا مەدح بکرێت، یان زیکر بکات و قورئان بخوێنێت و دەنگی خۆش بکات تا بڵێن دەنگی خۆشەو شارەزایە، یان بانگ بدات یان خۆی فێری زانستێکی شەرعی بکات، جا ئەگەر ریيا تێکەڵاوی کردەوە بوو بەتاڵی دەکاتەوە. چونکە هەموو مەرجی قبولّ بوونی هەموو کردەوەیەك دوو شتە: یەکەم: بە ئیخلاصەوە تەنها بۆ خوای گەورە ئەنجامبدرێن، دووەم: بەپێی شەرعی خوا بێت دوور لە زیادە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿.. فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ (الكهف:١١٠)

واتە: جا ئەوەی دەیەوێت بەدیداری پەروەردگاری شادببێت بەخۆشنودیەوە با کارو کردەوەی چاك و دروست ئەنجام بدات و بەهیچ شێوەیەك لە پەرستندا هیچ کەسێك نەکاتە هاوەڵ و شەریك بۆی و ڕوپامایی نەکات.

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): « قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِى غَيْرِى تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ ». رواه مسلم (٢٩٨٥).

واتە: خوای پەروەردگار فەرمویەتی: من لە هەموو کەسێك بێ نیازترو دەوڵەمەند ترم لە هاوبەش بۆ دانانم. هەر کەسێك کارێك ئەنجام بدات و کەسێکی ترم بکاتە هاوبەش تیایدا ئەوا خۆی و هاوبەشدانانەکەشی واز لێ دەهێنم.

وەپێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « ألا أخبركم بما هو أخوف عليكم عندي من المسيح الدجال؟ الشرك الخفي: أن يقوم الرجل فيصلي فيزين صلاته لما يرى من نظر رجل». أخرجه البيهقي وحسنه الألباني أنظر صحيح الجامع برقم(٢٦٠٧).

واتە: هەواڵتان بدەمێ بەوەی زیاتر لە مەسیحی دەججال دەترسم لێتان؟ شیرکی شاراوە: کە بریتیە لەوەی پیاوێك نوێژ دەکات و نوێژەکەی دەڕازێنێتەوە لەبەر ئەوەی خەڵکی سەیری دەکەن.

وەپێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: « إن أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر». قالوا: وما الشرك الأصغر؟ قال: «الرياء، يقول الله عز وجل لأصحاب ذلك يوم القيامة إذا جازى

الناس: إذهبوا إلى الذين كنتم تراؤون في الدنيا، فانظروا هل تجدون عندهم جزاء؟!». رواه أحمد والبغوي والطبراني وصححه الألباني السلسلة الصحيحة برقم(٩٥١).

واتە: ئەوەی کە زۆر دەترسم لێتان توشی ببن بریتیيە لە شیرکی بچوك. وتیان: شیرکی بچوك چیيە؟ فەرموی: ڕوپامایی(الرياء)، خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی‌دا کاتێ پاداشتی خەڵکی دایەوە بە وانەی ریاییان کردووە دەفەرموێت: بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانەی ئێوە لەبەر ئەوان کارتان ئەنجام داوە، جا بزانن پاداشتتان دەست دەکەوێت لایان!!

ابن القيم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: شیرکی نێت و مەبەست ئەمەش ئەو دەریایەیە کە کەناری نیيە ئەوەندە فراوانەو کەمێك نەبێت لێی ڕزگار نابن..../الجواب الكافي ص٩٤.

وە یەکەمین کەسانێك لە ڕۆژی دوایی‌دا دۆزەخییان پێ خۆش دەکرێت ئەو سێ کۆمەڵەن جیهادیان کردوەو شەهید بوون وە خێرو ماڵبەخشینیان ئەنجامداوەو زانست فێربوون و قورئانیان خوێندووە بەڵام ڕیاییان تێدا کردووە.

## کەفارەتی شیرکی شاراوە

عن معقل بن يسار قال: انطلقت مع أبي بكر الصديق (رضي الله عنه) إلى النبي(ﷺ). فقال: «يا أبا بكر! للشرك فيكم أخفى من دبيب النمل». فقال أبو بكر: وهل الشرك إلا من جعل مع الله إلهاً آخر؟ فقال النبي(ﷺ) : « والذي نفسي بيده، للشرك أخفى من دبيب النمل، ألا أدلك على شيء إذا قلته ذهب عنك قليله وكثيره؟». قال: «قل: اللهم إني أعوذ بك أن أشرك بك وأنا أعلم، وأستغفرك لما لا أعلم». صححه الألباني أنظر صحيح الأدب المفرد(٢٥٩/١) برقم(٧١٦/٥٥٤).

واتە: معقلی کوڕی یەسار دەفەرموێت: من و ابوبکری صدیق ڕۆیشتین بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: ئەی ابوبکر شیرك لە ناوتاندا شاراوەترە لە جێ پێی مێرووله. ابوبکر فەرموی: بۆ مەگەر شیرك تەنها ئەوە نیيە کەسێك پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا دابنێت؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە، شیرك شاراوەترە لە جێ پێی مێرووله، ئایا شتێکت فێربکەم ئەگەر بیڵێیت کەم و زۆریت لەسەر لادەچێت؟ فەرموی: بڵێ: « اللَّهُمَّ إنّي أعوذُ بِكَ أن أُشرِكَ بِكَ وَأنا أَعلَم، وأَستَغفِرُكَ لِما لا

أعلَم» واتە: خوایە پەنات پێ ئەگرم لەوەی شیركت بۆ بڕیار بدەم و بزانم، وە داوای لێخۆشبوونت لێ دەكەم لەو شیركەی دەیكەم و نازانم.

خوای گەورە بمانپارێزێت لە شیرك و جۆرەكانیو لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ پۆلی یەكخواپەرستاندا لە بەهەشتەكەی خۆیدا كۆمانبكاتەوە.......آمین

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

## سەرچاوەکان/

١- تەفسیرە کوردی‌یەکان: تەفسیری ڕامان... تەفسیری ئاسان... پوختەی تەفسیری قورئان.
٢- نور التوحيد وظلمات الشرك......سعيد بن علي بن وهف القحطاني
٣- كتاب التوحيد...................... صالح بن فوزان الفوزان.
٤- فتح المجيد شرح كتاب التوحيد...الشيخ عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ.
٥- تجريد التوحيد من درن الشرك وشبه التنديد..... فيصل بن قزار الجاسم
.
٦- المطلب الحميد في بيان مقاصد التوحيد...... عبد الرحمن بن حسن بن محمد بن عبد الوهاب بن سليمان التميمي.
٧- محرمات استهان بها الناس............الشيخ محمد صالح المنجد.
٨- منهاج الفرقة الناجية والطائفة المنصورة.....محمد بن جميل زينو.
٩- چەند سەرچاوەیەکی تر..........

## ناوەڕۆك